کەمال سەعدی و سابیر ڕەشید



# شەش کورتە چیرۆکی کوردی

؟

# شەش کورتە چیروکی کوردی


نووسینی :ـــ

کەمـال سەعدی
ســابـیر ڕەشید



ســـالی ١٩٧٦

پێشکەشە بە :ـ

* مرۆڤ
* ڕاستی
* گیانی پاکی مامۆستا حسێن حوزنی موکریانی

پیشەکی :-

زێڕ بچووکە بەڵام بە نرخە

# سێ چیرۆکەکەی کەمال سەعدی



* لە ساڵی ١٩٥٦ لە شاری هەولێر هاتۆتە سەر شانۆی ژیان .

* لە پۆلی شەشەمی وێژەییە .

* سەرباری ئەدەب خولیای هونەری تەشکیلی و هونەری فۆتۆگرافیە .

# شەوە زەنگەکە...

لە بیرمە ئەو ڕۆژەی هەر بەناو ڕۆژبوو لە ڕاستیدا تاریکە شەوێکی ئەنگوستە چاو بوو ، کە لە گوێ ئاگردانەکە دانیشتبوین پلکە هەمین چایەی تێ کردو لە پێشی دانایین ، هەرکەس چایەی خۆی خواردەوەو لێی ڕاکشا ، تەنیا من نەبێ جەستەم بەجێماو دڵم چووە جیهانێکی ترەوە .. جیهانی کوێرەوەری و مەینەتی چاو پێ هەڵنەهاتن !!! زۆرانبازی هەردەم لەمیانی خێرو شەردابوو ، سەرکەوتن بۆ خێرو ژێرکەوتن بۆ شەڕ بوو ... تاریکیش خۆی هەڵچنیبووە ڕووناکی .. دەم ووت ئەبێ جارێکی تر جیهانمان ڕووناك بێتەوە ... ڕۆژ لە وولاتمان هەڵ بێتەوە ! ؟

ئەوەی شـــایانی باســـە تاریکی لایەنگیری زۆر بوو !!!! شەمشەمەکوێرەکان بەئارەزووی خۆیان بە ئاسمانی قووڵو فراواندا خولیان دەخواردەوە • تاریکیش وەك ڕەشماڵێك خۆی هەڵکێشابوو بەسەرماندا .. دەرگای ڕووناکیمان لێ داخـرابوو ... چەلادەکان

بەئارەزووی خۆیان بەئلومـان دا دەسـوڕانەوە ... چرای گیـانی هەزاران کۆرپەیان دەکوژاندەوە بەراستی دۆزەخێکی سەر ڕووی ئەم زەمینە بوو !!

شاخەکان و کژوکیاکان کفنی سپیان لەبەر کردبوو .. دزو جەردە وەك مێشـوولە بەلاشـەی مـردوودا هەڵ دەگـەران ، ئـەو خوێنەی لە لاشەیان مابوو دەیان مژی .. وەك مۆرانە ئەوکفنەی پۆشیان کرابوو دەیـان قرتـانـد ...

جیهان کوژرابوو ، هەموو شتێك خولی سـەراوێی دەخواردەوە تاریکی تادەهـات باڵەپەستۆی دەخستە سـەر بەرەی ڕووناکی.. تاوای لێ هـات تەنها ڕووناکی چاووی خۆمم دەبینی ، لە پڕێکدا دەنگێك خـۆی هـەڵکوتا گوێما دەت ووت بروسـکەی بەهـارە بلێسـەی لە دڵما هـەڵگیرسـاند دەی گوت : « هـەموو تاریکی جیهـان کۆبێتەوە ڕووناکی ژیلە مۆیێکی پێ ناکوژێتەوە » ....

ڕاچڵەکیم و سـەرم هەڵبڕی سـەیرێکی ئاگردانـەکەم کرد ژیلە مۆیەکان بۆر هەڵکەڕابوون بە بەرگێکی ئەستوری خۆڵەمێش داپۆشرابوون .. فرمێسـك وەك کۆمـکەی ئاوێکی پەنك خواردوو لە کلێنەی چاوی پلکە ه.ەمین دا قەتیس مابوو ... ووتم بەخوا تاریکی دەسەڵاتی خۆی لەم جیهانەشدا سەپانـد !! ئەمەندەم ووت

کوێم لە ناڵەناڵێك بوو ، دەی ووت :« ئای بابە دەستم سوتا ، وام زانی کفنە ، ئەم زانی ژیلەمۆی لەژێرەو نەکوژاوەتەوە » !

کە ئەمەم بەرکوێ کەوت دۆزەخی جیهانەکەی ترم بیر کەوتەوە .. ئەوەی ڕاستی بێ هەر ئەوەندەم بیست ئیتر نەمزانی ئەوکەسە کێ بوو !! .... دووای تۆزێك یەك بەجێی پەنجەیەکی نارێك ڕووناکی لە تاکردانەکە بەدیار کەوت ، هەڵبەت ئەو ڕووناکیەش ڕووناکی ژیلەمۆیەکان بوو ... وە ئەوکات بەرە بەرە خۆڵەمێشەکەم لابردوو ڕووناکیەکی زۆرمان بۆ پەیدا بۆوە ...... ڕووم کردە پلکە هەمین‌و پێم کووت : پلە بۆچی فرمێسك لە چاوتا تەتیس ماوە ؟ ووتی : ڕۆڵە هەرچەندە چاووم بەم ژیلە ـ مۆیانە دەکەوێ ، دیمەنێکی دوور و درێژم دێتەوە یاد .. «ئەم ژیلەمۆیانە بەرە بەرە دەبنە خۆڵەمێش و ووزە و ڕووناکیەکی دیاری کراومان پێ دەبەخشن ، سەرەڕای ئەمانەش بەرگری تاریکی دەکەن ... بەڵێ ئەم ژیلەمۆیانە هەر بەخۆیان دانەگیرساون و لە خۆشیانەوە نەبونە بەرەژوو !! بەڵکو ئەوەی پێش ئێمە ئەم دارانەیان چاندووە ئێمەش وا بەهاوکاری هەموو لایەك کردو ـ مانە بەرەژوو وە ـ ووتاندومانەو داماان گیرساندووە و کردومانە بە ژیلەمۆ ... خۆمانی پێ لە سەرما دەپارێزین و بەرهەڵستی هێزی

ئاریکی پێ دەکەین ... جا بۆیەش کریانم دێ بەبینینی ئەم دیمەنانە ، چونکە لە ئەنجامی بەراورد کردندا ئەو کەسانەم وەك ئەم ژیلەمۆیانە دێنە بەر چاو .

هەولێر
١٩٧٣

# سەرەتای زستانێکی تووش

ئێوارەیە ... ئاسمان رووی گرژە .. پارچە هەوری پیس و چەپەڵ وەکو تارا رۆژیان لە باوەش گرتووە ، رۆژیش لە تاوا سورهەڵگەراوە و بەرە و خۆر ئاوا ملی رێگای گرتۆتەبەر ... جا هەورەکان هەرکاتەی بەرەنگێك خۆیان دەنوێنن ... زەرد .. سوور .. سەوز وا پێ دەچێت بیکاتە بارانە . ئەوا دەنگی بروسکەیەك هات لە بەرەکەی ئاسماندا ، دیارە کردیانە راستی !

بەڵێ ، گرمە گرمی هەور و شرقە شرقی بروسکە و لورە لوری باو خشەی دار و درەخت دەستی پێ کرد .. جیهان گۆرا .. هیچ شتێك لە سەر دەقی جارانیدا نەما .. بانەکانیش

چاوڕێی باکوردانن . . بەپەلە خۆم گەیاندەوە ئاوایی ، کۆڵانەکان کش و مات بوون . . چۆلەکەکان خۆیان لەژێر پەلەسواندە شرەکانی خانوەکاندا وێك هێنابوو ... باڵیان بەسەر لەشیاندا شۆڕبوو . . دەم نا دەمیش کە ئەوژمی با ڕووی تێ دەکردن هەموو گیانیان دەستی دەکرد بە لەرزین و بەولاو بەولادا دەکەوتن ، ناچاردەبون پەنا بەرن بۆ شوێنێکی کش و هێمن ... جیا منداڵان تەپکە و داویان بۆ دا دەنانەوە ، ئا بەم جۆرە دەست بەسەر یان دەکردن ...

دیتنی ئەم دیمەنانە زستانێکی تووشیان هێنامەوە یاد ئەزویەکی سارد هاتە لەشما لەگەل ڕاپەڕیم و سەیریکی خۆرئاوام کرد . . بەرە بەرە هەورەکان ڕەنگەکانیان وون دەکرد ، ڕەش هەڵگەڕان ، ئەم جارەیان بەتەواوی خۆر ئاوابوو .

دەتەووت بەئۆبەت لەگەل مانگدا چەرخەچینە ، ... لەولاوە مانگ لە شێوەی کچێکی چواردە ساڵی خۆی دەرهێنا ، بێ ئەوەی بزانێ سەرما و گەرما چیە ، دەستی کرد بە خولانەوە بەناو ئاسمانی تووشدا ... تاو تاویش هەوری پیس بەری رووناکیان لێ دەگرتین .. دیارە کار وا ناڕەوا .. لە هەموو لایەك دەست کرا بە چرا پێکردن ... خەلکی خۆیان ئامادەکرد بۆ بەرگری سوپای

سەرما ، لە زارکی لوولـە سۆپەکاندا دوکەڵی ڕەش دەستی کـرد بە بەرزبونەوە بە دڵێکی پڕ لە قینەوە دەچوون بەگـژ سەرمـادا . سەرماش پتر سوپای غەزەبی دابەزاندە سەر هـەرێمەکانمان ، تـا دەشهات بروسکەی هەور زیادی دەکردو بـە نـاو ئاسمانـدا بڵاو دەبۆ وە ... دەنگی نـاسـازی بەرز دەکردەوە ، پـڕ بـە دەنگی دەینەڕاند بەگوڕی ئاگری لە دەم دەهاتە دەر . بـاران دەستی پێ کرد .. بە ڕێژنە دەبـاری .. بەرەو کێوو دەشت و دۆڵەکاندا بـە تیژی دەهاتە خوار .. چەند دارو کرش‌و کاڵی بەیار هەیە لە گەڵ خۆیدا ڕاپێچی کردبون ، ڕووی تێمان کرد ... لافـاو هەڵسا .. لە هەموو لایەك پڕ بە دەنك هاوار دەکـرا — لافاو لافاو — ، هاوڕێیان لافاوی ئەمجارەمان توندو تیژە .. خوێنی لێمان دەوێ ، بێ خوێن ناڕوا ئەم بەڵایە ....

هەولێر

نەورۆزی

١٩٧٤

؟

هەموو رۆژێك فڕۆكەكانی دوژمن ئەو ناوەیان بۆردومان دەكردو ناپالم و گازو تیزابیان بە سەر ئاوایییەكە بەردەداوە ... هەركاتێك گرەی شتێك دەهات لە هەموو سوچێكی ئاوایییەكە دەبووە دەنگە دەنگ و هەڵاتن و بەدەم راكردنەوە دەیان ووت ! — هات !!

ئەم هاتە هاتە ببوە هێمای فڕۆكە هاتن ... كاتێك كە دەوترا هات ، هیچ كەس لە شوێنی خۆی نەدەما ، یا ئەوەتا هەر لەو شوێنەوە خۆیان دەدا بەزەویا ، یان بەرەو حەشارگەكان دادەبەزین كە بۆ خۆ حەشاردان دروست كرابوون ، ئەم رۆژگارە رەشە ماوەیەكی زۆری خایاند ، تف لە دەمی گەورە و بچووك تاڵ بوو بوو !! زەویش توانای بە خۆگرتنی شەهیدانی نەمابوو .. لاوانی ئازادیخواز بە دەستێكیان چەكیان هەڵگرتبوو ، بەرامبەر دژومن دەجەنگێن و بە دەستەكەی تریان قوڵینگیان رادەوەشاندو گۆڕیان بۆ خۆ هەڵدەكەند ... دیمەنێكی زۆر سەر سوڕمێن بوو ، ئەمە

یەکەم جاربوو کە شتی وابیبنم مرۆڤت خۆی گوڕ بۆ خۆی هەڵکەنێ ، دیارە ئەوەی ئازادی بوێت پێویستە لە پێناویدا بمرێت .

ئەم کارەساتانە ماوەیەك بون ، بەڵام کاتێك شۆڕشگێڕان نیشتە جێی شاری ئاسایش و هێمن و دوور لە شەڕ و شۆڕ بوون ، ئەم دیمەنانە هەر لە بەر چاوو ئەندیشەی خوێن گەرمان مابوو و نەسڕابوونەوە ... دەنگی تەیارە و تەقینەوەی تونبلەی قاکراوی و ناپالمەکانی کاتی شەڕ بەم دوا دووایە لە گوێی شۆڕشگێڕان دەزرنگایەوە .

شەو درەنگ بوو ، هەموویان لە سەر بانە بچکۆلانەکە لێی ڕاکشابوون ... گرە گرێ ڕەشە لۆریەك لە سەری کۆلانەکە دەستی پێ کرد ، دیار بوو هەندێك کەل و پەلی دەگوێزرایەوە ... بەرە بەرە دەنگەکە لێیان نزیك دەبووەوە ... لە پڕ لە خەو ڕاپەڕی و خۆی دایە پەنا دیوارەکە و بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد ، هات !! کشتیان سەریان سوڕما لەم ڕاپەرینەی ، دەستیان گرت و پێیان ووت :

چیتە دەڵێی خەونت بینیوە ، وا ڕاچڵەکی ؟ ! بەڵام ئەم قسانە هیچ سوودیان نەبوو ، کابرا هەر بەردەوام بوو لە سەر قسەی خۆی و دەی ووت :

خۆتـان حەشاردەن هـات !!

دووای ئەوە ڕەشە لۆریەکە دوورکەوتەوە و دەنگەکە نەما ، ئەوسا بەرەولایان هات‌و بە ئەسپایی پێ‌یانی ووت : کووا بۆ کوێ ڕۆیشت ؟ !

کابرا سەری سوڕما کە ئەوانیش ئاگاداری ئەم باسە نەبوون ... کەتیان دایان لە قاقای پێکەنین :

ئەوە چیتە دەڵێی تیك چوویت ؟ !

ئەوسا بەسەرسوڕمانەوە ووتی :

هـــا ! ئـــەوە ئێوەن ، چـــما لێرەین ! وام زانی . . . واتزانی چی ؟

وام زانی لە شەڕدام‌و فڕۆکە ئاواییەکانمان بۆردومان دەکات .

ها .. ها .. ها !! ئەمە دەنگی ڕەشەلۆریەکەی کەڕەك بوو ، لات بۆتە دەنگی فڕۆکە !!

مـایس

١٩٧٦

# سێ چیرۆکەکەی سابیر ڕەشید



* — لە ساڵی ١٩٥٦ لە دایــــک بووە .

* — لە پۆلی شەشەمی وێژەییـــە .

* — دەستی ڕەخنەو کورتە چیرۆکی هەیە .

## « زۆربەمان لەم شەوە دەمرین
## بەڵام بابزانین کێ لەدایك دەبێ»

چواردە ساڵ چاوەڕوانی !! بە ڕاستی ستەمە . . . .
هەر کە گوێی لەو ماوەیە دەبوو موچرکێك لـە تەوقی سەریەوە تا ژێر پێی دەکرتو دەستی دەنایە ژێر چەناکەی خۆیەوەو مەلی خەیاڵی لە شەقەی باڵی دەداو چاوەکانی ڕەشکەو پێشکەیان دەکردو هەموو جیهانی بە ڕەشی دەهاتە پێش چاو . . . بە هیچ کلۆجێك ئاگای لە بـاوك و براو دایك و کەسی تری نەدەما . . تنۆ تنۆك ئەسرین لە چـاوە قەتیسماوەکانیـا دەتکا . . . بڕوای بە هیچ مرۆڤێك نەبوو لەو سەر زەمینە . . . کەسێکیش نەبوو گوێی لە کروزانەوەی ئەو بەسەزمانە ڕابگرێو هەوڵێکی بۆ بدات . . . بۆیە کەلێك جار هەر خۆی دڵی خۆی خۆش دەکردەوەو بیری لەو چوار ساڵە دەکردەوە کە پێکەوە دەستیان لە مل یەك دەکردو هێشتا شۆخەکەی بە ڕێو جێی خۆی نەگەیشتبوو و مەرگەوەڕیش نەکەوتبووە گیانیانەوە . . . بۆیەش هەمـوو جارێك لەگەڵ بە بیر هاتنەوەی دیمەنی ئەو چوار سـاڵەدا . . . دەکەوتە نـاو دەریـای خەیاڵو بیر کردنەوەیەکی قووڵ . . . لە سـەر دارو دیواری

ژووره‌كه‌شی نووسیبوو ( چوار ســـالی زیڕین‌و چوارده ســـال چـاوه‌ڕوانی ) . . هه‌ر چی خـزم‌و ئاسـیاویشی هه‌بوو ده‌یـانزانی مه‌سـه‌له چیه‌و له هه‌وه‌له‌وه‌ش هه‌وڵێكیان بۆ نه‌دابوو بۆیه خـۆیان لێ كاس ده‌كرد . . زۆر جارانیش هه‌وڵیان له‌گه‌ڵ ده‌دا كه واز له‌و خه‌یالاّنه بێنێ‌و زه‌ماوه‌ندێكی بۆ بكـێڕن . . بـه‌لاّم به هیچ شێوه‌یه‌ك دڵیان پێ زیندوو نه‌ده‌كرایه‌وه‌و . . . دڵی وه‌ك خه‌ڵـوز ڕه‌ش هه‌ڵگه‌ڕابوو . . . ئێواره‌یه‌ك چه‌پكه گوڵێكی جوانی له ده‌ست خـــۆی گرتبوو و گه‌ڕایه‌وه ماڵه‌وه . . چه‌پكه گوڵه‌كه‌شی له ناو په‌رداخه ئاوێكه‌وه ناو به‌و نیازه‌ی به‌یانـــی به دووای گۆڕه‌كه‌ی بگه‌ڕێ‌و ئه‌و چه‌پكه گوڵه له سه‌ر سـینه‌ی گۆڕه‌كه‌ی دابنێ تا له خه‌و ڕاست بێته‌وه‌و بزانـێ ئه‌و هه‌ر زیندووه‌و نه‌مـردووه به‌لاّم نه ئه‌و گۆڕه‌كه‌ی پێ ده‌زانی نه ماڵـی باوكی شۆخه‌كه‌شـی له‌وێ مـابوو تا پرسیاری گۆڕه‌كه‌یانی لێ بكا ؟ بۆیه سه‌ری سوڕمابوو ! ! نه‌ی ده‌زانی چی بكات بۆیه ویستی واز له‌و خه‌یالاّنه بێنێ‌و سه‌ر بكاته سه‌ر سه‌رینه‌كه‌ی . . . به‌لاّم ده‌نگی ده‌ركاكه لێی نه‌گه‌ڕاو ئاكاداری كرده‌وه سه‌یری كرد هه‌ژاری بـــرای بچوكی بوو . . نامه‌یه‌كی له ده‌ست بوو به شله‌ژاوی‌یه‌وه دایه ده‌ســـتی . . پێشی ووت كه له نیوه‌ڕۆوه نامه‌كه هاتووه‌و ئێستا بیری كه‌وتۆته‌وه بیداته

دەست .. ئەمیش بە غەمگینیەوە نامەکەی کردەوە چاوێکی پێدا خشاند .. حەپەسا !!

هەر لەبەر خۆشیەوە دەی ووت : ـ چۆن وایە ... کەواتە قسەی ئەم خەڵکە هیچی ڕاست نیە .. بۆیە بە سەرنجەوە لە نامەکە وورد دەبووەوە نامەکەشی دەی ووت : ( ئازیزەکەم .. هەر چەند لە کاتی خوێندنەوەی ئەو نامەیەم دوور نیە وا تێگەیشتبی کە من مردووم .. بەڵام لە ڕاستی دا من هەر لە ژیان دام .. ئەوەش بزانە من تۆم لە یاد نەکردووە و ئێستاش لە بیرمە پاش چواردە ساڵ خۆشەویستی و چاوەڕوانی بە یەك نەگەیشتین .. ئێستاش هەر یادی چوار ساڵە زێڕینەکەم لە بیرەو لە بیرم نەکردووە .. بەڵێ گیانەکەم دوور نیە بپرسی کە ئەوکاتەی بە کەژاوە دەیان هێنام بۆ مەرکەوەڕمان و لە پێش چاوی خەڵکی لە هۆش خۆم چووم بردمیانە خەستەخانە بۆ ئەمانەوە ... و دوایی دەنگ و باس وا بڵاو بووەوە کە مردووم نەخێر گیانە ... ئەو کاتە ئێمە ئەو ناوەمان بەجێ هێشت و کەوتینە ڕێ بۆ ئەڵمانیا و نەهاتینەوە .. ئەویش لەبەر خەڵکی بوو .. نەمانتوانی بگەڕێینەوە .. دەزانم بە هەواڵی نەمردنی من گەشایەوە بەڵام دووا تکامە .. لە بیرم کەو زەماوەندێك سازکە هەتا منیش

ئەو کاتە بتوانم بکەڕێمەوە و پێکەوە دەست لە ناو دەست هەڵپەڕین‌و سەر چۆپێ ڕەشبەڵەك بکەرین ئیتر تا ئەو کاتەی خونچەی ئارەزووەکانمان دەپشکوێ ) .

گوڵی ژاکاوت ـ شیرین ـ ٨ / ٥ / ١٩٧٥ ئەڵمانیا

هەر کە نامەکەی خوێندەوە لە جێی خۆی ڕاچلەکی‌و بە گریانەوە ووتی ـ نەخێر .. من نابێ تۆ لە یاد بکەم .. هەر دەبێ بتگەمێ‌و دەست لە ملت وەربێنم .. هەر دەبێ بگەڕێمەوە تێر .. ڕات موسم .. ئەمڕۆ نەبێ سبەی .. بەیانی .. لە مردن .. هەر دەبێ بە یەك بگەین ...

لەگەڵ ئەو دەنگ هەڵبڕینەی دایك‌و باوکی و براکەی هەڵسان‌و ڕوویان کردە ژوورەکەی‌و وایان دەزانی خەونێکی ترسناکی دیوە بۆیە بەرداخە ئاوێکیان بۆ هێناو دڵیان دایەوەو بە ئارامی خستیانە سەر جێکاکەی‌و بەجێیان هێشت ...

ئەم شەوە خەونی بە شۆخەکەوە دیت ، وای دەزانی دەستیان لە مل یەك کردووەو هەردووکیان پەڕو باڵیان بۆ دروست بووەو بەرەو ئاسمان بەرز دەبنەوەو بە دەوری ئەستێرەکاندا دەخولێنەوە . . تەماشای زەمینی دەکرد وای دەزانی ئەوەی مرۆڤە سەیریان دەکاو سەری لە دیاریان سوڕماوە کە خەلکەکەش

تەماشایانی دەکرد ئەوانیش سەریان سوڕدەما !! بۆیە کۆمەڵە نیشانەی پرسیارێك لە ئاسمانەدا ترووسکانەوە ...
مەرکەوەرەکەشیان کە ئەمەی بینی دارو دیواری تێکەیاندو دەی ووت : ـ ئەمانە نەمردوون بەڵام دەیانەوێ لە مردن بە یەك بکەن ... خەڵکەکەش وەڵامیان دەدایەوە و دەیان ووت : ـ
زۆربەمان لەم شەوەدا دەمرین بەڵام با بزانین کێ لە دایك دەبێ ؟ !

؟ ؟ ؟ ؟ ؟ ؟ ؟ ؟

مایس ١٩٧٦

# * باوەشی خەم *

بە هیچ جۆر دیمەنی ئەو ڕۆژەم لە یاد ناچێتەوە ... هەموو جاران .. کە بیری لێ دەکەمەوە وەکوو شریتی سینەما وایە لە پێش چاووما دەسوڕێتەوە .

ئەو ڕۆژەی پەڵە هەورێکی ڕەش و چلکن بوو بووە بەربەستێك و شینایی ئاسمانی لە پێش چاوان شاردبووەوە جار جارەش کلافە ڕەشەبایەکی تیژڕۆ بە دەروازەی کۆڵانو شەقامەکان وەردەبوو دەیکردە تەپ و تۆز و هەر چی پەڕە کاغەز و شتی وردەڵە و سووك هەبوو هەمووی لەگەڵ خۆی ڕادەپێچا و دەبوە تۆپەڵێکی ڕق و خۆی دەهاویشتە باوەشمانەوە . ماوەیەك بوو لەبەر دەرگای دوکانی مەلا عەلی ئارامم گرتبوو .. هەر سەیری دیمەنی ئەو ڕۆژەمان دەکرد هەر بەیەکەم لای ئەو مامە پیرە بوو کە لەپێش دوکانی مام عومەری سەرتاش ڕایەخی لێ ڕاخستبوو و سوالی دەکرد ... هەر لەبەر خۆشمەوە جار جارە سەیرێکم دەکرد و ڕووم لە مەلا عەلی دەکرد و دەمگووت :

- بە ڕاستی ژیان ڕێگایەکی سەختە .. نان پەیداکردنیش ماندوو

بوون و ئارەقە ڕشتنی دەوێ .
ئەویش وەڵامی دەدامەو دەیگووت :

ـ ژیان بازنەیەك نیە لە دەست بگرێ بەڵكوو دەریایەكی قووڵ بێ بنە كەس ناتــوانێ بە تەواوی مەلە لە هەموو لایەكانی بكات . . . هەر ئەوەنـدە چـاوم نوقـاند كڤەی بـاكە لە كوێـما چەخماخەی دا چاوێكم هەڵبڕی ئەبینم كۆمەڵە كاغەزێك خــۆی هاوێشتۆتە باوەشم . . . منیش سەیرێكم كردن و هەمووم دانە بەر با . . ئاوڕم لە مامە پیرە دایەوە ئەبینم كۆمەڵەكاغەزێك لە باوەشی ئەویش‌دا خۆیان كرتۆتەوە بەڵام لەگەڵ خـۆ داتەكاندنی زۆربەی كاغەزەكان لە شەقەی باڵیان داو هەڵفڕین هەر زوو بانگی كوردستانی كچی مام عومەری كرد كە تازە لە قوتابخانە دەهاتەوە ڕووی دەكـردە دوكانی باوكی . . . بۆ ئەوەی سەیری كاغەزەكانی بۆ بكاو بزانێ چ هەواڵێكی داڕفێنی كرتۆتە خۆ . . ئەمیش بە دڵێكی خۆشەوە بە پیر كاغەزەكانەوە چـوو چونكی ئەویش حەزی دەكرد لە نهێنیەكانی ئەم پەڕە كاغەزانە بكات . . . یەكە یەكە چاوی بە پەڕە كاغەزەكاندا دەخشاند هەر چەندی هەڵی داوە هەمووی بێ كەرد بوون . . . یەكە یەكە هەمووی دەدایە بەر بایەكەو باڵیان دەكرت . . . تا لە دووا پەڕ ڕەشایی نووســینێك لە پێش چاویا خـوڵ خوارد . . . بۆیە

چاوەکانی خۆی هەلکلوفت و نیکاکانی بریە پەڕەکاغەزەکە مامـە پیرەش هەر بە دەم پرسیارەوە ڕووی لە کوردستان دەکرد و حەزی دەکرد بەشداری بکات لە نهێنی ئەم پەڕە کاغەزانە ئەمیش نهێنی ئەم پەڕە کاغەزەی بە گوێیا چرپاند کە لێی نووسرابوو : ( خەم بـاوەشـی بۆ کشتمـان کردۆتەوە ) لە ژێـر ئەویشدا نووسرابوو : ( بۆ خەم دەژین چونکە خەم هاوتەمەنمانە ) . . .

مامـە پـیرەکە کە ئەم ووتانە لە گوێچکەیا کینگلی خوارد، هەناسەیەکی قووڵ لە دەروونیەوە سەری هەڵدا و تۆزێك سەری خۆی لەقاند و ووتی :

ـ بەخوا ڕاستە خەم وەك سێبەرمان وایە هەر لە تەکمانە

ـ مامە خەم وەکوو نان و ئاو وایە برسیەتیمان ناهێڵێ و تینوێتیمان دەشکێنێ . . .

ـ ئێوەش لە خەم گەیشتوون ؟

ـ بەڵێ وەکوو بە گوێمدا چرپاندی خەم باوەشی بۆ کشتمان کردۆتەوە . . .

ـ بەڵام هێشتا لە ناو لەپی خەمن . ، هێشتا نەکەوتوونە ناو باوەشی خەم . . .

ماوەیەکی دوور بوو مەلی بیرم باڵەفڕکەیان بۆ لای ئەم

مشت و مڕ کردبوو ئاوە ئاوەش سەیرێکی ئاسمانم دەکرد هەر وەکوو جاران پەلە هەورە ڕەشەکەم بەژوور سەرەوە بوو . . هەر لەگەڵ ئەوەش ڕووی خۆم وەردەچەرخاند. لای وێستگای پاسی هات و چۆکە کە چۆن خەڵکەکە بە پەلە پەل خۆیان دەکوتایە بن وێستگاکە و لە دەست ڕەشەباکە ڕایان دەکرد بەڵام سوودی نەبوو هەر دەیگرتنەوە و تۆز و خۆڵی بەرەو ڕوویان ڕاپێچ دەکرد . . .

پاش ئەوەی مەلی ئەندێشەم باڵەکانی وێك هێناوە وچاوم لە دیمەنی ئامە پیرە پۆشـــی بۆ جارێکی تریش چاوم بڕیەوە وێستگاکە . . . کابرایەکی هەناسە سوار بە پەلە خۆی کوتایە ژێر وێستگاکە . . . کابرا لە دیمەنی ئەم کێژەنە سەری سوڕمابوو بۆیە ســـەیرێکی ئەملاو ئەو لای خۆی دەکرد و چاوێکی دەبڕیە زەلامەکانی تەنیشتیەوە و دەیپرسی :

ـ بەخوا پایزێکی ووشك و بریشکە . . . ڕەشەبایەکی تالەباری لەگەڵ خۆی هەڵگرتووە . . .

هەر ئەوەندەی زانی وەڵامی پرسیارەکەی بە گوێدا چرپا :

ـ نەخێر بەهارە .

ئەمیش بە سەر سوڕمانەوە هەڵیدایەوە و ووتی :

ـ ئەی بۆ گەڵای دارەکان زەرد هەڵگەڕاون ؟

ـ ئەوە لە ترسی مەرگ خۆیان مراندووە .

ـ نەخێر ئەوانیش بۆ خەم دەژینو خەم باوەشی‌تێ وەرێناون بۆیە ڕەنگیان کزڕاوە .

نەورۆزی

١٩٧٦

هەولێر

# * شـــەویکی ژوان *

ئەم شەوە وەکوو هیچ شەوێکی تر نەبوو . . . بە هیچ جۆرێك خەو لە چاوم نەدەکەوت چاووم بڕیبووە ئاسمان ئەستێرە کەشەکان لە پێش چاوما دەهاتن و دەچوون سەیری مانگە شـەوم دەکرد کە لە ژیانمدا شەوێکی وا خۆش و جـوانم نەدی بوو . . حەپە حەپی سەگ و دەنگی کاروانچیە قاچاغ چیەکان ئەو ناوەیان پـڕ کردبوو . . . جار جارەش لورە لورێکم لە جێگایەکی دوور دەهاتە گوێ . . خورە خوڕی ڕووباریش هەر مەپرسە چ کارێکی دەکرد . . . هەندێك جاریش بایەکی فێنکی دەهێنا هەر دەت ووت بای کوێستانە لە لای چیایە سەر کەشەکانەوە دێ بە ڕاستی دیمەنی ئەو شەوەم بە هیچ جۆرێك لە یاد ناچێتەوە جار جار باوشکێکم دەهێنا بەڵام خەوم لێ نەدەکەوت کەوتبومە ناو دەریای خەیال . . تا ئەو کاتەی سەیری کات ژمێرەکەم کرد ئەبینم کات چی وای لە نیوە شەو کەمتر نی‌یە بە ئەسپایی هەستامەوە ســـەر پێ خۆم کورج و کۆڵ کردو جامێـــك ئاوی ساردیشم نۆش کرد تا وەکوو بەتەواوی دڵم ئارامی‌کرت ئینجا تاوێك ڕاوەستام‌و سەیرێکی پێش

خۆم کرد ئەبینم بە جوانی هەموو جێگایەکم بەدی دەکرد بە بێ ئەوەی
کەسمان هەست پێ بکا ملی ڕێگام گرت‌و فانۆسـە تێك قوپاوەکەشم
لەگەڵ خۆم ئەبرد چونکە مانگە شەو هەمـوو جێگایەکی ڕووناك
کردبوەوە . . ووردە ووردە بە ناو کۆڵانە تەسکەکانا هەنگاوم دەنا . .
چرپە چرپی گەڵای دارو خشپە خشپی گژو گیای سـەر ڕێگا
تووشی ترسیان کردبووم چار چارەش تەماشایەکی ژێر پێی خۆم
دەکرد سێبەری خۆمم دەبینیەوە ئەوەندەی تر ڕادەچڵەکیم . . قیرە
قیری بۆق و دەنگـی ئاوی ڕووبارەکانیش تا دەهات زیاتـر دەبوو
چار چارەش خەریك دەبـوو پێـم زەوی نەدکـرێ دەت ووت
بارێکی قورسم لە سەر شانە و پێیەکانم بەستراونەتەوە . . سەرێکم
هەڵبڕی زۆرم نەمابوو بکەمە ئەو جێگایەی کە من و جوان دەست
نیشاندان کردبوو . . . هەستم بە یەکێك کرد لەو ناوە تا دەهات
لێم نزیك دەکەوتەوە . . . خوایە دەبێ ئەوە جوان نەبێ ؟ ! بە ڕاستی
ئەو بێ باشە ! ! کورە هەوە هەو . . نەء بە خوا لەو بڕوایەدا نیم
ئەو بێ چونکی ڕۆیشتنی بەو ناچێ . . ! !

هەر لەبەر خۆشـمەوە بـڕیارم دا کە ئەگەر ئەو بێ . .
بەیانی خۆم‌و گوێ درێژەکەم دەچمە دار کردن پاشان دەچمە شارو
بارە دارەکە دەفرۆشـم ئینجا ئەو پارەی دەسـتم کەوت بەشێکی

بە ئان دەدەم بە سەر هەژارانی گوندەکەمانی دابەش دەکەم و ئەوی تریش هەڵدەگرم . . !

تا دەهات زیاتر لێم نزیك دەکەوتەوە . . کۆخە کۆخ و بەرز بونەوەی دوکەڵی جگەرەی وایان تێگەیاندم ئەو کەسە زیاتر بە پیاو بدەمە قەڵەم نەك بە ئافرەت . . . ترسیش تا دەهات خۆی دەکرد بە تۆپەڵێکی ڕق و خۆی دەکوتایە ناو دڵم . . خەریـــك دەبووم لە ترسا خـۆم بە فەتـارەت بدەم بەڵام ئامۆژگـاری‌یەکانی باوکم دەهاتەوە یـاد کە دەی ووت : ( ڕۆڵە ترس بۆ پیاو نەهاتووە ئەوەی بترسێ بە پیاو دانانرێ ) . . . منیش ترسـم لە کۆڵی خۆم فڕێ داو بازووی خۆم لێ هەڵکرد و شــــێرانە بە ڕێگادا ڕۆیشتم تا ڕووم بەرەو ڕوی کابرا بوو ئینجا کابرا بە کۆخەکۆخ سـڵاوی لێ کردم و منیش بە هەمان شت لێی تێپەڕ بووم . . . ماوەیەك بوو لە یەك دوور کەوتبووینەوە هێشتـا ئاوڕمـان لە یەك دەدایەوە تا بە تەواوی چـاومان لە چاوانی یەکـتر بزر بوو ئینجا بە زەردەخەنەیەکی کورتەوە ملی ڕێگـاکەم گرتەوە تـا گەیشتمە جێگاکە . . . سەیرێکی جێگاکەم کـرد بینیم کەس دیار نی‌یە دەستم کرد بە دەنك هەڵبڕین ئەو دەنگەی تەنیا من و جــــوان دەمانزانی . . لە لورە لورو قیرە قیرو میاوە میاو زیاتـــر هیچ

دەنگ دانەوەم بەدی نەکرد . . ماوەیەك بە غەمگینییەوە دانیشتم . . هەر لەبەر خۆشمەوە دەم ووت :ـ

ـ ( دەبێ جـــوان بۆ نەهاتبێ !! . . دەبێ لە خـەو مابێتەوە ! خۆ تا ئەو کاتەی جێگاکەشمان دیاری کرد نەســاغ نەبوو . . بە ڕاستی سەیرە لە وەتی من جوانم خۆش دەوێ هیچ جارێك بەڵێنی بە درۆ دەرنەچووە ) . . بەو جۆرە ووتانە خەریك ببووم کەوتبومە ناو دونیای بیرکردنەوەو لێکدانەوە . . هەڵسامە سەرپێ و ویستم بڕۆمەوە . . گوێم لەو دەنگە بوو کە دەمانزانی . . بۆ جارێکی تریش گوێزرامەوە بۆ جیهانی شادمانی زۆری نەمابوو لە خۆشیان دوو باڵ بە خۆمەوە نێم و هەڵبفڕم . . . چاوەڕوانم کرد تا جوان گەیشتە لام بە تەواوی ڕوومان بەرەو ڕووی یەکتر بوو ماوەیەك بەبێ دەنگی کپ بووین . . پاشان پرسیارم لە بابەت گیربونەکەیەوە ئاراستە کرد . . . ئەو شـــەوە کاتێکی ئێجگار کورتمان ڕابوارد بەڵام هەر خۆش بوو چی وامان لە شـــەوانی پێشوو کەمتر ڕانەبوارد ... زۆری نەمابوو کەڵەشێری بەیانی دەست بە بانگ دان بکا چۆلەکەکان لە کوێسوانەکان بخوێنن . . . بـۆ جارێکی تریش ماڵ ئاواییمان لە جێـگاکە کـرد ئینجا کەوتینەوە ڕێ تا گەیشتینەوە ئاوایی . . لە نزیك ماڵی جوان وەستاین تا

ئەو شەوە خوا حافیزیمان لە یەکتر کرد هەر وەکوو جاران دەستم کردەوە بە ڕۆیشتن ئەوەندە خێرا دەڕۆیشتم هەر دەت ووت پالم پێوە دەنێن . . . سەگەکانی ئاوایی هەموو پێکرا چاویان لە شەو زەق کردبووەوە تا دەهات زیاتر دەستیان بە حەپە حەپ دەکرد . . . چی وای نەمابوو خەڵکی گوندەکەمان لێ هوشیار بکەنەوە . . . هەر چۆنێکی بوو خۆم گەیاندە کۆڵانە تەسکەکە . . . زۆریش لەوەی دەترسام کە لە ماڵەوە بە ئاگابن ئەو کاتەی دەگەمەوە ماڵەوە . . . گەلیك خەیالی قوول قوولم دەهاتە پێش چاو . . . ویستم واز لەو خەیالاتانە بهێنم بەلام ترسی ماڵەوە بەرۆکی بەر نەدەدام . . . زۆرم نەمابوو کۆڵانە تەسکەکە کۆتایی پێ بهێنم . . . ویستم لە چلپاوەکەی سەری کۆڵان بپەڕمەوە . . . لە بانەکەی بەرامبەرم گوێم لە زەلامێك بوو بانگی کردم :ـ کابرا تۆ کێی . . لە جێگای خۆت نەبزوی . . تۆ دوژمنی منی هاتووی بمکوژی . . . نازانی من لە تۆ هوشیارترم .

ـ کورە برا گیان بەخوا ڕێبوارم پێرە تێدەپەڕم .

ـ نەخێر شتی وا نی یە هاتووی من بکوژی !

هاوینە هەواری شەقلاوە

تشرینی دووەمی

١٩٧٤

* — له زۆر شوێنـــان نووسەر دوومانگ پێش لـــە چاپدانی بەرهەمەکەی هێلکاریەك دەکات تـا بـزانێ چەند قـازانج دەکات ... بەڵام ئێمە چوارمانگ پێش لـە چـاپدانی بیر لەوەدەکەینەوە کە دەبێ چەند زیان بکەین !!

?

# Six Kurdish Short Stores

By

*Sabir Rashid and Kamal Sahdi*

نرخی « ١٥٠ » فلسه

---

ژمارەی سپاردنی بە کتێبخانەی نیشتمانی ( ٩٩٨ ) ١٩٧٦/١٠٠٠
چاپخانەی شارەوانی هەولێر